٢

چەند نامەیەک لە

# یەکتاپەرستی

منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

نامەی دووەم

## بەشەکانی یەکتاپەرستی

عزالدين عبدالرحمن امين

چەند نامەیەك لە

# یەكتاپەرستی

## نامەی دووەم

## بەشەكانی یەكتاپەرستی

عزالدين عبدالرحمن امیـن

١٤١٤ هـ ـ ١٩٩٣م

إن الحمد لله، نحمده ونستعينه، ونستغفره ونستهديه، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا، ومن سيئات أعمالنا، من يهده الله فهو المهتدي، ومن يضلل الله فلن تجد له وليا مرشدا، واشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، واشهد أن محمدا عبده ورسوله، صلى الله عليه وعلى آله وأصحابه ومن سلك سبيله واهتدى بهداه وسلم تسليما كثيراً .

# بەشەکانی یەکتاپەرستی وسەرئەنجامی لە ئیسلام دەرچـــون

یەکتاپەرستی سێ بەشە:

١ ـ یەکتایی پەروەردگاری

٢ ـ یەکتایی خوایی

٣ ـ یەکتایی ناوو رەوشتەکانی خوا

# یەکەم

# یەکتایی پەروەردگاری
# (توحيد الربوبية)

خوای مەزن داهێنەری ئادەمی زادە، رزقیان پێ دەبەخشێ دەیانمرێنێ لەم دونیایە و زندویان دەکاتەوە لەو دونیادا، وەیان خواناسینە بەتەنهایی لە هەموو کردەوەکانی خوایەتی دا، بۆ وونە دەبێت باوەڕی وئیمان وابێت، خوای بەخشندە داهێنەرەو روزی بەخشە. ئەوەش دانی پیانراوە لە لایەن هەموو نەتەوەو موشریکەکانی کۆن ونوێ وجوولەکەو خاچ پەرستان، لە رابردوو ئیستاشدا، هیچ کەسێك نەبووە ئینکاری ئەو جۆرە صیفەتانەی خوای (سبحانه' وتعالى) بکات، تەنها

کۆمۆنیستە خوانەناس و کافرەکانی ئەمرۆ نەبێت.

لێرەدا لەو نەفام وبێ هۆشانە پرسیار دەکەین، کە ئینکاری بونی پەروەردگار دەکەن، دەڵێین ئایا کەرخ و شوێنەوار (أثر) لە خۆیەوە هاتوتە کایەوە بەبێ(مؤثر)؟! وە ئایا داهێنراو (خلق) بەبێ داهێنەر (خالق) دروست بووە؟! هەڵبەتە ئەوەی بە قەد تۆزقاڵێك خاوەنی عەقل وهۆش بێت دانی پیادەنێ هیچ شتێك لە خۆیەوە دروست نەبوە و نابێت.

بۆ نمونە کاتێ دەرزیەك دەبینی، دڵنیایت لە خۆیەوە دروست نەبووەو، بەڵکو وەستایەکی هەبووە دروستی کردبێت، باشە ئەگەر عەقلی مروڤ رێ نەدات ئەو دەرزوە بچکۆلەیە لە خۆیەوە دروست ببێت! ئەی چۆن رەوایە بلێی ئەو گەردوونە سەیرو عظیمە کە عقل وهوش سەر سام دەکات لە خۆیەوە هاتووتە کایەوە، بەبێ دروستکار؟! وە ئایا دەگونجێ بلێیت ئەو هەموو ئەستیرەو، هەورو، گەوارەو، مانگ وئەستیرەو، بروسکو، زەمینو، دەریاو،

شەوو رۆژو، تاریکی وڕووناکی ودرخت وگوڵ وگوڵزارو، جنوکە وئادەمیزادو، ئاژەڵ وپەرەندە... هتد، کە بە هیچ شیوەك لە ژمارە نایەت بلێیت لە خۆیانەوە دروست بوونەو هیچ داهێنەریان نیە؟!.

والله ئەوەی توزقالیك هوش وتێگەیشتنی هەبێت ئەو جۆرە بۆ چوونانەی نابێت.

بەکورتی بەلگە لەسەر (یەکتایی پەروەردگاری) یەکجار زۆرە بە ژمارە نایەت، بۆ نمونە بە دیقەت بڕوانە ئەو فەرمودانەی خوای (تعالى):

(١) ﴿ **أم خُلِقوا من غير شيءٍ أم هم الخالقون أم خلَقوا السموات والأرضَ بل لايوقِنون** ﴾ (الطور:٣٥-٣٦)

«ئایا ئەوان (واتە ئەو کسانەی گومانیان هەیە لە بوونی خوای (جل جلاله)) لە خۆیانەوە دروست بووینە بەبێ هیچ هیزێك و خورسکن؟ یان بەخۆیان خۆیان دروست کردوە؟ وەیان ئاسمان و زەمینیان دروست

کردوە؟!.

نەخێر ئەو جۆرە شتانەیان پێ دروست ناهێت، بەڵام باوەڕ بەراستی ناهێنن».

لیرەدا ئەتوانین بلێین سێ ئحتماڵ هەیە بۆ ئەو مەسەلەیە.

یەکەم: پەیدا بوون بە بێ هیچ شتێك ولە خۆیەوە: لە پێش هەموو شتێك عەقل و فیطرەت ئەو بۆ چوونە وەرناگرێ، بۆیە پێویست بە شی کردنەوەو لێکولینەوە ناکات.

دووەم: مرۆڤ بە خۆی خۆی دروست کردبێ: ئەوەش هیچ کەسیك نەیگوتەوەو ناتوانێت بلێت کە بەدەستی خۆی خۆی دروست کردبێت.

سێ یەم: خوای گەورە دروستیانی کردوە: ئەگەر ئحتمالی یەکەم ودووەم نەبێت و نەگونجیت لەگەڵ فیطرە، کەواتە هیچ ئحتمالێکی تر نیە بۆ ئەوە، هەر تەنها ئەو راستیە نەبێت کە قورئانی پیرۆز بومانی باس دەکات،

ئەویش ئەمەیە هەموو گیان لەبەرێك دەستكردی خوایەو خوای (تعالی) خۆی دروستیانی كردوە، وە هیچ كەسێك هاو كاری خوای نەكردوە لە داهێنانیان، بۆیە بە هیچ شێوەیەك نابێت هاوبەشی بۆ پەروەردگاری (الربوبیة) وپەرستنی خوای گەورە، پەیدا بكرێت.

(٢) ﴿ الله خالق كل شيء وهو على كل شيءٍ وكيل﴾ (الزمر: ٦٢)

«خوای مەزن داهێنەری هەموو شتێكە، وهەموو شتێك لە ژێر ویست ودەسەلاتی خوای گەورە دایە».

چەند بەلگەیەك لە دان پێداتانی موشریكەكان بۆ (یەكتای پەروەردگاری) دەهێنینەوە:

(١) ﴿ ولئن سألتهم من خلق السموات والأرض ليقولن الله قل الحمد لله بل أكثرهم لا يعلمون﴾ (لقمان: ٢٥)

«ئەگەر لێیان بپرسی كێ زەمین وئاسمانەكانی دروست كردوە؟ ﴿ ليقولن الله﴾ لە

وەلاما دەلێن: الله.

مروڤی خاون بیرو هوش کاتێ لەگەل فیطرەێ خۆی دەکەوێتە بیر کردنە وە ولێکدانەوە، خۆی بۆ ناگیرێ، دان بەراستی دادەنێ.

﴿ ولئن سالتهم من خلق السموات والأرض؟﴾ ئەگەر پرسیاریان لێ بکەی کێ ئەرز و ئاسمانەکانی دروست کردوە؟ ﴿ ليقولن: الله﴾ بێ گومان لە وەلامدا دەلێن: الله، ﴿ قل: الحمد لله﴾ دوا بە دوای وەلامەکەیان خوای تعالی بەپێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ بلێ: ﴿ الحمد لله﴾ الحمد لله لە روون وئاشکرایی حەق وراستی، الحمد لله لەسەر ئەو دانپیانانە یان.

﴿ بل اكثرهم لا يعلمون﴾ بەلام زۆربەی زۆریان نایزانن، نازانن ئەو جیهانە بەلگەیە لەسەر داهێنەرە عەزیەکەی».

(٢) ﴿ قل من يرزقكم من السماء والأرض أمّن يملك السمع والأبصار ومن يخرج الحي

**من الميت ويخرج الميت من الحي ومن يدبر الأمر فسيقولون الله فقل افلا تتقون؟›** (يونس: ٣١)

**‹ قل: من يرزقكم من السماء والأرض›**

«مەبەست: بە هۆی باران بارین، زەوی زیندو دەبێتەوە، واتا هەرچی سەوزی و میوەو دانە ویلە هەیە ...هتد سەوز دەبێتەوە لە سەر رووی زمین بە هۆی ئەو بارانە، ئەبێت بەرزق وخواردن بۆ ئادەمی زاد، هەروەها لە ئاژەل و بالندەو هەمووشتێکی تری دەریایی و زەمینی سوودیان لیێ وەردەگرن بۆ خواردن وگەلێ شتی تر.

**‹ ام من يملك السمع والأبصار›** جگە لە خوای (جل جلاله) دەبیێ کویێ بتوانیێ هێزو توانا بدات بە گوێچکەو چاو بۆ ئەوەی بتوانن بەکاری خۆیان هەلسن؟.

وە ئەگەر لە کار کەوتن کویێ ئەتوانیێ دروستیان بکاتەوە؟.

ئەو دوو ئەندامە جوان و رێك وپێکە کە جێگای سەر سورمانی زۆر بەی زانایانە لە شێوەی پێك هاتنیان ,

هەلسانیان بەو دوو کارە سەیرە لە گوێ لێ بوون هەیتندا.

﴿ ومن یخرج الحي من المیت ویخرج المیت من الحي؟﴾ لە پێشینان هەرشتێ کپ ودامرك وبێ جولە بایە پێ یان دەوت بێ گیان،وە هەرشتێك لە گەشەو جولانەوە دا بایە پێ یان دەوت زیندە هەر بۆیە ناوەروکی پرسیارەکە بەڵگە بوو بۆیان لە سەر دەر چوونی چوزەرە (وەك شتیکی زیندو) لە دنکە دانەوێلە یەکدا (کە بە مردوو دادەندرا) هەروەها پەیدابوونی دانەوێلە پاش سەوز بوون، ودەرچونی جووجەلە لە هێلکە و پەیدا بوونی هیلکە لە مریشك... هتد، لایان جێگای سەر سورمان بوو، وە لە راستیدا ئەوانە جێگای سەر سورمانن.

﴿ ومن یدبر الأمر؟﴾ لە وشتانەی کە باسکراو لە هەموو شتێکی ناو ئەو گەردوونە کێ بە ریوەیان دەبات وکارو باریان دەسوورێنێ؟.

﴿ فسیقولون الله﴾ بێ گومان لە وەڵامدا

ئـەڵێن ﴿الله﴾.

ئەوسەر لێشواوانە ناتوانن ئینکاری بوونی خـوای (جل جلاله) وهێزو توانا و دەسەلاتی خوای تعالی لەسەر ئەم گەردوونە بکەن، بەڵام لە ئەنجامی لار بوونی خورسکیان (فطرة) وایان بەسەردێت..... لەگەڵ بوونی ئیمانیشیان کە هاوبەش پەیدا بکەن بۆ خوا، بۆیە بە دوای ڕێبازو بەرنامەو دەستوورو بیرو بۆ چوون و.... شتی تر دەکەون بە هیچ شێوەیەك خوای (جل جلاله) پێ ی ڕازی نیە.

﴿فقل افلا تتقون﴾ پێ یان بلێ لە خوای داهێنەر بترسن ئەو خوایەی رزق وژیان ومردن و، وە هەموو کارو کردارێك کە بە هیچ هێزێك ئەنجام نادرێ بە دوو پیتی کاف و نون (كُنْ) ئەنجامی ئەدات.

بگەرێنەوە سەر دەستوورو ڕێبازی خوا، ڕووبکەنە فەرمانەکانی خوای میهرەبان و گوێ ڕایەلی تەواوی بکەن».

(٣) ﴿ ولئن سالتهم من خلق السموات

والأرض ليقولن خلقهن العزيز العليم﴾ (الزخرف: ٩)

«ئەی پیغەمبەری خوا ئەگەر پرسیاریان لیٚ بکەیت: ئایا کیٚ ئاسمانەکان و زەوی دروست کردوە؟. بیٚ گومان ئەڵین: خوا دروستی کردوون کە زاڵە بەسەر هەر شتیٚکاو ئاگادارە بە هەمور شتی».

ووشەی (شرك) لەبنەڕەتدا لە ووشەی (شركة) وەرگیراوە واتا موشریکەکان دانی پیادەنیٚن (إقرار) بە یەکتایی پەروەردگاری، بەلام هاوبەشیك بۆ خوا دادەنیٚن لە پەرستندا، وەك دوو کەس بەشدار بن لە کاریٚکدا.

لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هاوبەشەی بۆ خوایان داناوە، بە یەکسانی نازانن لەگەڵ خوادا لە هەموو شتیٚکا، بەتایبەتی لە دروست کردن و، داهیٚنان و، سوودو زیان بەخشین.

تەنها لە گوی رایەلی وملکەچی وخۆشەویستی نەبیت.

بیٚ گومان تەنها بە یەکتایی پەروەردگاری مرو ناچیتە

ناو چوار چێوەی ئیسلام، هەتا باوەری تەواوی نەبێت بە یەکتایی خوایی (توحید الألوهیة)، وە بە بنچینە کانی هەلنەستێت، واتا لە سەر مروڤ پێویستە بەگفتەو کردەوە بە بنچینەکانی یەکتایی خوای هەلسێ، بۆ رزگار بوونی لە دوزەخ لە روژی دوایی.

## دووەم

# یەکتایی خوایی (توحید الالوهیة)

یەکتایی خوایی (یەکتایی پەرستن)یشی پێ دەوترێ، مەبەست لە (یەکتایی خوایی) تەنها خوا پەرستی یە، راتا هەموو جۆرە پەرستنەکان (عبادات) وبەندایەتی تەنها بۆ خوا دەبێت، چونکە هەر خوای (سبحانه وتعالى) شایەنی پەرستنە بەبێ هاوبەش.

هەلبەتە کاری سەرەکی هەموو پێغەمبەران، (علیهم السلام) بانگەواز بوە بۆ یەکتاپەرەستی

خوا دەفەرموێ ﴿ **ولقد أرسلنا نوحاً إلى قومه إني لكم نذير مبين، أن لا تعبدوا إلا الله إني أخاف عليكم عذاب يوم أليم** ﴾ (هود: ٢٥ - ٢٦)

﴿ **ولقد أرسلنا نوحاً إلى قومه** ﴾ «یەکەم

پێغەمبەری خاوەن (رسالة) کە بۆ ئەهلی زەمین هاتبێ، نوح پێغەمبەر بووە (علیە السلام). بۆ راست کردنەوەی بیرو باوەڕە پوچەکانی موشریکەکان کە بتیان دەپەرست، ولە ریگای راستی یەکتاپەرستی یان لآ دابوو.

﴿ إني لكم نذير مبين﴾ واتا: گەڤی خوای گەورەتان پێ ڕادەگەیەنم خۆتان دووربکەنەوە لە پەرستنی غیری خوای تاك وتەنها، بۆ ئەوەی ڕزگارویێت لە عەزابی خوای (جل جلاله) لەڕۆژی دوایی، بۆیە فەرموی:

﴿ أن لا تعبدوا إلا الله﴾ وازبێنن لە پەرستنی بت و طاغوت، وازبێنن لە ریێ کردن لەسەر رێبازی دەستکردەکان، وازبێنن لە رێبازی شەیتان.... هتد.

بەلکو روویکەنە خواو تەنها خوا بپەرستن و لە سەر رێبازی خوا بڕون.

﴿ إنی اخاف علیکم عذاب یوم ألیم﴾ ئەگەر ئێوە بەردەوام بن لەسەر شرك و هاوبەش پەیداکردن بۆ خوا، لە رۆژی زیندو بوونەوە خوا عەزابێکی پڕ ئێش

ژانتان ئەدا».

هەروەها دەفەرموێ: ﴿ وإلى عاد أخاهم هوداً قال: يا قوم اعبدوا الله ما لكم من إله غيره، إن أنتم إلا مفترون﴾ (هود: ٥٠)

﴿وإلــى عــاد أخــاهم هــودا﴾ «واتــا هــود پێغەمبەرمان بۆ قەومەکەی ڕەوانە کرد، هەروەك نوح پێغەمبەرمان ڕەوانە کرد بوو (عليهم السلام).

﴿ قال: ياقوم﴾ زۆر بە نەرمی و بەزمانی شرین بە قەومەکەی ئەفەرموێ ﴿ يــاقوم﴾ ئەی قەومی خــۆم ﴿ اعبدوا الله﴾ تەنها خوا بپەرستن ﴿مالكم من إله غيره﴾ چیتان داوە لە ڕێبازی چەوت وسەرلی شێواوی، چیتان داوە لە بت وصنم وغەیری خوا پەرستی؟!».

بەکورتی هەموو پێغەمبەران ڕەوانە کراون بۆ مەبەستی یەکتایی خوایەتی (توحيد الألوهية)، وە بانگکردنیان بۆ خوا پەرستی و دوور کەوتنەوە لە تاغوت و بت و صەنەم،

هەروەك خوا دەفەرموێ:

﴿ ولقد بعثنا في كل امة رسولاً ان اعبدوا الله واجتنبوا الطاغوت﴾ (النحل: ٣٦).

«واتا بۆ هەموو گەلّ و نەتەوەیەك، وە بۆ هەموو كات و زەمانێك، پێغەمبەرێكمان رەوانە كردوە، وە هەمویان بانگی نەتەوەكەی خۆیانیان دەكرد وپێ یان رادەگەیاندن تەنها خوا بپەرستن، جگە لە خوا هیچ شتێكی تر نەپەرستن و بەدوای هیچ رێبازێكی تریش نەكەون.

هـەمـــوو پێغـــەمبەران بانگـاوازیـــان بۆ نـەتـــەوەو میللەتەكانیان بانگەواز بووە بۆ پەرستنی خوای (جل جلاله) ﴿ يا قوم اعبدوا الله مالكم من إله غيره﴾. پەرستن زۆر جورە لەمانە، نوێژ كردن و رۆژی گرتن وحەج وطواف ونەزرگرتن واعتكاف وقوربانی سەربرین، وەكرنوش بردن و، ترس و، تەوەكول و، پارانەوە و، دوعا كردن،جیهاد وحوكم كردن بە دەستوری خواو.... وەزور شتی تر كە بۆ هیچ داهێنراویك ناشیت تەنها بۆ خوای (جل جلاله) نەبێت.

## له جۆرەکانی پەرستن:

### حاکمیـەت:

ئەگەر هات و بە ووردی سەیری ئەو ئایەتە پیروزە بکەین: ﴿ **وإن تطع أكثر من في الأرض يضلوك عن سبيل الله، إن يتبعون إلا الظن، وإن هم إلا يخرصون**﴾. (الأنعام: ١١٦)

زۆر بەی زۆری مرۆڤ لە رابردودا، هەروەك ئیمرو لە جاهلیەت و گومڕایی دا دەژیان.

جاهلیە تەکەشیان دوور کەوتنەوە بوو لە ڕێبازی خوا، وەحاکمیەتیان نەدەدا بە خوا، شەریعەت وقانونی خوایان لە هەموو کارێکیاندا بە دەستوری خویانیان دا نەدەنا هەروەها بیرو بوچوون و دەستوری ژ یان و، هەلس وکەوتیان بە پێی ویست و ڕێبازی خوا نەبوو، وەك مەردومی ئیمرۆی چەرخی ئیستامان، لە تاریکی وسەر لیّ شێواوی وگومڕایی دا دەژیان.

وازیان لە فەرمانەکانی خوا هێنابوو،بە دوای (گومان

و مەزەندە) کەوتبون، (گومان و مەزەندەش) هەلبەتە مرۆڤ بەرەو گومرایی رادەکیشێ، بۆیە خوای مەزن، پێغەمبەرو موسلمانانی ئاگادار کردوە، بە دوای ئەو نەفام و وجاهیلانە نەکەون، گوێ رایەلیان نەکەن، بۆ ئەوەی توشی گومڕایی نەبن، لە ڕێبازی خوا دورر نەکەونەوە.

هەروەك ناگونجێ جگە لە خوا کە سێکی تر بە داهێنەر (خالق) ورازق بزاندرێ، هەر ئەو هاش نابێت، جگە لە خوای زانا ودانا هیچ کە سێکی تر بە قانون و دەستور دانەر و حاکم دابنرێ.

ئەو خوایەی قورئانی بۆ ئادەمی زاد رەوانە کردوە، کە بەراستی دەستوری تەواوە بۆ مروڤ، بە بێ کەم وکوڕی، ئەگونجی بۆ هەموو کات وشوێنیك، هەر چەندە مروڤ بگاتە پلەی بەرز لە شارستانیەتی وپێشکەوتن، چارەسەری گیرو گرفتەکانی خۆی لە هەموو لایەنێکەوە، رە لە هەموو کاتێکەوە لە هیچ دەستور ورێبازێك

نادۆزێتەوە، تەنها لە قورئانی پیرۆز نەبێت، کە واتە چۆن ئەبێت گوێ ڕایەڵی مرۆڤی نەفام بکرێت، لە بەر پێچی فەرمانە پیرۆزەکانی خوای میهرەبان، با هەرخەڵەتاوان ژمارەشیان زۆر بێت ﴿وإن تطع أكثر من في الأرض...﴾

﴿وإن أطعتموهم إنكم لمشركون﴾ (الأنعام: ١٢١)

کێشە کە یەکە چ حاکمیەت بدرێتە غەیری خوا، وە چ غیری خوا بە داهینەرو رازق و پەروەردگار بزانریت، جیازوازی نیە، هەر دوو لایەنی یەکە!!.

بەلام ئەوەی جێگای سەر سوورمانە ئەوەیە موسلمانانی ئیمرو زۆر بە توندی نوێژ کردن و رۆژ و گرتن و کڕنۆش بردن... بۆ غەیری خوا رەت دەدەنەوە، رازی نابن لە پێشیان ئەو جۆرە کارانە بکرێت چونکە زۆر بەکوفرێکی گەورەی دەزانن، لە هەمان کاتدا کاتێ دەبینن حوکم بە قورئان ناکرێ وحاکمیەت ئەدرێ بە غەیری خوا،ودستوررو قانونی کوفریان لە دەرەوە بۆ

دەهێنن، وە بە زۆڵە ملی ولە سەر حسابی خوێن ومال وناموسیان بەسەریان دا دەسەپێنن، بە ناچاری ملیان پێ کەچ دەکەن و، وردە وردە فەرمانە کانیان پێ ئەنجام دەدەن.

بە هیچ شێوەك بە بیریان دا نایەت ئەو کارە رەت بکەنەوەو دژی بووەستن و بەکوفری گەورەی بزانن.

پێویستە لەسەر موسلمانانی ئەمرۆ چۆن تەنها خوا دەپەرستن وکڕنوش بۆ هیچ کەسێکی تر نابەن هەروەهاش ئەبێت حاکمیەت نەدرێتە غیری خوای (جل جلاله) رازی نەبن بە حوکم وشرعی کوفر بەلگەش لەسەر ئەمانە لە قورئانی پیرۆز گەلێ زۆرە بۆ نمونە:

﴿ قل اغير الله اتخذ ولياً فاطر السموات والأرض﴾ (الأنعام: ١٤)

«واتا: ئەی پێغەمبەری خوا تۆ بەو موشریکانە بلێ و پرسیاریان لێ بکە ﴿ اغير الله اتخذ ولياً﴾ ئایا دەتانەوێ جگە لە خوای (جل جلاله)، کە داهێنەری ئەرزو

ئاسمانە، و رزق وژیانی هەموو گیانلەبەرانی بەدەستە، وخوشی پێویستی بە خواردن ورزق نیە، ئەتانەوێ جگە لە خوای (جل جلاله) کەسێك وشتێکی تر بکەم بە خواو پەروەردگارو ناصر وپشتوانی خۆم؟!!.

لە واتای ئەو ئایەتە پیرۆزە وادەردەکەوێ ولایەت دان بە کەسانی غەیری خوا و ترسان لێ یان و هانا بردنە بەر غیری خوا و پارانەوە لێ یان هاوبەشیە بۆ خوای (جل جلاله) گومانی تیا نیە.

بە دیقەت بڕوانە، ئەو ئایەتە پیرۆزەی کە دەفەرموێ:

﴿ قل اغير الله ابغي رباً وهو رب كل شيء ﴾ [1]

ئەی محمد ﷺ بەو موشریکانە بلێ ﴿ اغير الله ابغي رباً وهو رب كل شيء ﴾ دەتانەوی جگە لە خوای (جل جلاله) کە پەروەردکاری هەموشتێکە لەم گەردونەدا کەسان و رژێم وشتی تریکەمە پەروەردگاری خۆم و بیان پەرستم؟!.

---

(١) (الأنعام: ١٦٤)

ئەی پێغەمبەری خوا پێ یان بڵێ بە موشریکەکان دەتانەوێ جگە لە خوای (جل جلالە) خوایەکی تر بپەرستم؟!.

جوان بڕوانە ئایەتەکە ئەفەرموێ ﴿ وَرَبُّ كُلِّ شَيْءٍ ﴾ واتا تەنها خوایە پەروەردەگاری من و ڕۆژە وژیان ومردن و هەموو شتێکم بەدەست ئەوە، هەر بۆ لای خوا ئەگەڕێمەوە لە هەموو شتێك، وهەرپشت بەویش دەبەستم لە هەموو کاروبارێکدا چونکە هەموو شتێك بە دەستی خوایە، خوا توانا دارە، لە سەر هەموو شتێك.

بەگشتی لەو ئایەتە پیرۆزە بۆمان دەردەکەوێ کە دەبێ بەدلسۆزی پشت بە خوا ببەستین و بە دلسۆزی تەنها ئەو بپەرستین و هاوبەشی بۆ خوا پەیدا نەکەین لە هیچ شتیك دا نە لە گەورە و نە لە بچوك.

خوای (جل جلالە) پروەردگاری هەموو شتیکە ﴿ وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ طَوْعًا وَكَرْهًا ﴾ (الرعد: ١٥)

﴿ وإن من شئٍ، إلا يسبح بحمده ولكن لا تفقهون تسبيحهم﴾ (الإسراء: ٤٤)

﴿ وإن من شيء إلا يسبح بحمده﴾ «هەرچی دروستكراو هەیە هەموویان تەسبیحاتی خوا دەكەن، وە هەریەكەیان بە شێوەیەك و رێگەیەك و زمانیكی تایبەتی خویان.

﴿ ولكن لا تفقهون تسبيحهم﴾ بەڵام ئیوە ئەی ئادەمیزاد لە تەسبیحاتی (كەژو گیاو درخت و هەموو بی گیانەكان وەك بەردو شاخ.... هتد) تیێ ناگەن چوونكە زمان و دروست بوونیان جیاوازە لەگەڵ ئیوە.

هەموو شتیك لە نیو ئاسمان وزەویدا كڕنۆش بو خوای (جل جلاله) دەبن .

بەپێی رژێم ودەستوری خوا دەخولینەوە. بەڵام ئەوەی جێی سەر سورمانە ئەوەیە ئەو مرۆڤە زەعیف وبیێ دەسەڵات و نەفامە یاخی دەبێت و هەڵدەگەرێتەوە لە خوڕسكی خۆی، خوا بە خوای خۆی نازانێ، بە لكو لە

جێگای خوا بت وصەنەم وزۆر دار و طاغوت[1] بە خوای خویان دەدانێن، ئەوەش کوفرێکی رووتە و لە ئیسلام

(١) طاغوت: لە ووشەی (الطغیان) وەرگیراوە واتا لە سنور دەرچوون. شەیتان، جادو گەرو هەرشتێك، وەیان کەسێك لە جیاتی خوا بپەرسترێت بە طاغوت ناو دەبریت.

ابن القیم (رەحمەتی خوای لێ بیت) دەلێ (هەرچی دەرچوونی بەندە هەیە لە سنووری دیاری کراویدا، پێی دەوترێ طاغوت لە گوێ رایەلی وشوێن کەوتن و پەرستنی، غیرا خوای گەورە، طاغوتی هەر میللە تیك حاکمی ئەو میللە تە یە کە حوکمی یان لە سەر دەکا بە غیرا شەریعەتی خوا، نەئەوەوگەلیش گوێ رایەلی وشوێنی دەکەون وملکەچی دەبن لە هەمو فەرمانەکانی بەبێ ئاگاداریان لە شەریعەتی خوا.

لێرەدا ئەگەر لە مە وورد ببینەوە بۆت روون دەبێتەوە کە حوکمی قانون لە طاغوتی دایە، وە حاکمی هەر قانونیك طاغوتە، چونکە بە دەستوورو رێبازی قورئان حوکم ناکات، وە بە دەستور و رژێمی تر حوکم دەکات، لە لایەن مرۆڤ داهێنراوە خوای (جل جلالە) لە چەند جێگادا لە قورئانی پیرۆز دەفەرموێ ﴿إن الحکم إلا لله﴾، ﴿ومن احسن من الله حکماً لقوم یوقنون﴾

هەروەها دەفەرموێ ﴿فلا وربك لا یؤمنون حتى یحکموك فیما شجر بینهم ثم لا یجدوا في أنفسهم حرجاً مما قضیت ویسلموا تسلیماً﴾.

وە دەفەرموێ: ﴿فإن تنازعتم في شيء فردوه إلى الله والرسول﴾

هەروەها دەفەرموێ ﴿ومن لم یحکم بما أنزل الله فأولئك هم الکافرون﴾

دەرچونە.

لە نێوەڕاستی سورەتەکدا خوا دەفەرموێ لە سەر زمانی پێغەمبەر ﷺ ﴿افغير الله ابتغي حكماً وهو الذي انزل إليكم الكتاب مفصلاً﴾ (الأنعام: ١١٤)

«خوای گەورە بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ، بڵێ ئەو نەفامانەی هاوبەشیان بۆ خوا پەیدا کردوە لە جێگای خوا دەیانپەرستن.

﴿افغير الله ابتغي حكماً﴾ ئایا دەتانەوێ جگە لە خوای (جل جلاله) حەکەمیکی تر داوا بکەم بو برینەوەی کیشە کە لە نیوانی من وئیوە؟!.

﴿وهو الذي انزل إليكم الكتاب مفصلاً﴾ ئەو خوایەی قورئانی بۆ ئێوە ڕەوانە کردوە، هەمو شتێکی تیادا لێك جیاکردۆتەوە، ڕوون وئاشکرایي کردوە بوتان».

ئەو دڵ ڕەش و دڵ ڕەقانەی سەریان لێ شێواوەو لە تاریکی نەفامی دا دەژین. نازانن وبێ ئاگان ئیسلام

رازی نیه له چاولیّکردن و لاسایی کردنەوەی کوێرانه و وەرگرتنی هەموو شتێك، هەتا لە زانایان و موجتەهیدەکانیش، چونکه ئەو جۆره کارانه تەنها بۆ پێغەمبەر دەبێت، واتا هەر پێغەمبەر ﷺ هەمو شتێکی لیّ وەر دەگیریّ بیّ رەت کردنه وه، بەڵام جگه لە ئەو واتا لە پێغەمبەری خوا ﷺ هەرکەسێك بێت، چ زانا وه چ موفتی بێت، شتی راست ودروستی لیّوه ردەگیریّ، وشتی ناریك ونارەوای لیّ وەرناگیری و بۆی رەت دەکرێتەوه.

باشه ئەگەر ئەوه دەرحەق به زانایان و عالمانی موسلمانان بیت، ئاخو دەبێت دەرهەق بەوکەسانەی رژێم ودەستوری دروستکراو دادەنێن دەبیّ چۆن بێت؟ که هیچ پەیوەندیەکیان نیه به ئایین و خواپەرستی.

هەروەها له جورەکانی عیبادەت، حوکم کردن به دەستوری خواو ترسان وپارانه وه و پشت بەستن (توکل) وقوربانی و نەزرگرتن و دوعاو جیهادو.... زور شتی تر که ناگونجیت بو هیچ داهینراویك تەنها بو خوای (سبحانه

وتعالى) نەبێت.

هەموو پێغەمبەران تەنها بۆ مەبەستی یەکتاپەرستی خوایی نێراون بۆ نەتەوەکانی خۆیان، بۆ ئەوەی مرۆڤ ئاگادار بکەنەوە، هاوەڵ پەیدا نەکەن بۆیەزدانی تاك و تەنها.

جێگای داخە هەندێ کەس بە دوای ئارەزوی خۆیان ئەکەون بەتایبەتی ئەوانەی بیرو باوەری چەوتیان هەیەو ریگایان لێ گوم بووە، وەك گورپەرستەکان وسەرلیشیواوەکان کە هاواری پیاوچاکان ئەکەن بۆ لا بردنی تەنگ و چەڵەمە لە سەر خۆیان، وداوای یارمەتی یان لێ ئەکەن وئەڵین ئەمانە ئەولیای خوان، توانای دەستکاریان هەیە لە ژیان ومردن، لەگەڵ ئەوەشدا معلومە کە مردوو بۆ خۆی هیچی پێ ناکرێ نەك بۆ کەسانی تر

خوا ئەفەرموێ: ﴿ أمَّن يجيب المضطر إذا دعاه ويكشف السوء ويجعلكم خلفاء الأرض ءإله مع الله﴾ (النمل : ٦٢)

«مرۆڤی بێ چارە لە کاتی شڕی و تەنگانەیی دا زوو روو دەکاتە خواو، پەنای بۆ دەبات و، داوای یارمەتی لە خوا دەکات بەتایبەتی کاتی ئومێدی دەبڕێ لە هەموو هێزو دەسەلاتە کانی کە هیوای پێ یان هەبووە لە کاتی شێنەیی دا، ئا لەو کاتەیە زۆر بە گەرمی و پڕ بە دل وگیان دەگەڕێتەوە بۆ لای خوای میهرەبان، ئەگەرچی لە کاتی شێنەیی وئاسای هەر خواشی لە بیر نەبووە.

بەلام خوای مەزن بە میهرەبانی خۆی هەرچونی بێت یارمەتیان ئەدات ولە ناخوشی دەریان دەهێنی.

﴿ ویجعلکم خلفاء الأرض﴾ تەنها خوایە، نەوە لە دوای نەوە جێ نشین دەکات لەسەر زەمین.

﴿ ءإله مع الله﴾ لە کاتی بە هانا هاتن و لابردنی گیروگرفت و ناخوشی، وە نیشتە جی کردنی مروڤ لەسەر زەمین و.. ئایا خوایەکی تر هەیە لەگەل خوای پەروەردگار؟.

نەخێر! ئەگەر بهاتبایە مروڤ بە ووردی بیری لەو

راستیانه بکردبایەوە، هەمیشە پەیوەندی خوی لەگەل پەروەردگار نەدەپچراندو هاوبەش و بەشداریشی بۆ خوای (تعالی) دا نە دەنا».

هەروەها ئەفەرموێ: ﴿ قل من ینجیکم من ظلمات البر والبحر تدعونه تضرعاً وخفیة لئن انجانا من هذه لنکونن من الشاکرین، قل الله ینجیکم منها ومن کل کرب ثم انتم تشرکون﴾ (الأنعام:٦٣-٦٤)

﴿ قل من ینجیکم من ظلمات البر والبحر﴾ «ئەی پێغەمبەر ﷺ پێ یان رابگەیەنە کێ هەیە جگە لە خوای (جل جلاله) بتوانێ رزگاریان بکات لە تەنگ وچەلەمە و ناخوشیەکانی بەسەریان دێت لە نێو زمین و دەریا دا؟.

﴿ تدعونه تضرعاً وخفیة﴾ لە کاتی تەنگانەیی و ناخوشی وگیرو گرفتا بە نهێنی وئاشکرا داوا دەکەن و دەپارینەوەو دەڵێن ئەی خوایە گیان ﴿ لئن انجانا﴾ ئەگەر رزگارمان بکەی لەو گیروگرفتو ناخوشی یە ﴿ لنکونن

من الشاكرين﴾ دەگەڕێنەوە سەر ڕێبازی خوا پەرستی و چی تر هاوبەش پەیدا ناکەین.

﴿ قل الله ينجيكم منها ومن كل كرب﴾ پێ یان بلێ خوای (سبحانه وتعالى) رزگارتان دەکات لە هەموو تەنگانەو وناخۆشیەك».

خوا تەنها خۆی بەتوانایە، بۆ یارمەتی دانی لێ قەوماوان، و لا بردنی ناخوشی وگیر و گرفت، و گەیاندنی خێروخوشی، بە پێچەوانەی باوەری نەفام وگورپەرستەکان کە کەوتونەتە ناو گێژاوی هاوەل پەیدا کردن (شرك) بۆ خوا .

لیرەدا بۆ مان روون دەبێتەوە هەرکە سیك عیبادەت کردنی بە دروستکراو بەند بکات، ئەمە وەها دەگەیەنێ کە ئەم دروستکراوەی بە خوا نزیك کردۆتەوە .

ئیمام نەوەوی (خوای لی رازی بیت) ئەلی هاوەل پەیداکەر بۆ خوا ئەچێتە ناو دوزەخ، وهەمیشە لەناویدا ئەمینێتەوەو هەتاهەتایە نەمر دەبیت . هیچ جیاوازیان نیە لەگەل

جوولەکەو گاورەکان و بت پەرستانی تر .

(إمام أحمد) دەگێڕتەوە بۆمان لە (عدی کوری حاتم) (خوایان لی رازی بیت) کاتێ گوێی لە پێغەمبەر ﷺ بوو ئەو ئایەتەی دەخوێندەوە: ﴿ اتخذوا أحبارهم ورهبانهم أرباباً من دون الله والمسيح ابن مريم، وما أمروا إلا ليعبدوا إلهاً واحداً لا إله إلا هو سبحانه عما يشركون﴾ (التوبة: ٣١)

امام احمد (خوای لی رازی بیت) لە (عدی کوری حاتم) دەگێڕتەوە کاتێ (عدی کوری حاتم) دەعوەت نامەی ئیسلام بوونی پێ گەیشت، کە لە لایەن پێغەمبەرەوە بۆی رەوانە کرابوو،رای کردە شام،(عدی کوری حاتم الطائی لە پێش بوونی بە موسلمان خاج پەرست بوو).

لە پاش راکردنی بۆ شام خوشکەکەی دەستگیر کرا لە گەل کومەلێك لە هوزەکەی، بەلام پیغەمبەر ﷺ خوشکەکەی (عدي) ئازاد کردو بە دیاری بۆ براکەی رەوان کردەوە، کاتی (عدي) ئەمەی بیست، رووی کردەوە

شاری مدینه و له شام گەرایەوە، وهات بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، له کاتی گەیشتنی (عدي) پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە.

﴿ اتخذوا احبارهم..... ﴾ عدی گوتی ئەی پێغەمبەری خوا ئەوان (خاچ پەرستەکان) ئەحبارو رەهبانەکانیان نەدەپەرست، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (بلی إنهم حرموا عليهم الحلال واحلوا لهم الحرام فاتبعوهم فذلك عبادتهم اياهم) واتا ئەحبارو رەهبانیەکان حەلالیان حەرام دەکردوو حرامیشیان حەلال دەکردو وئەوانیش بەدوایان دەکەوتن بەراستیان دەزاني، ئەوەش عیبادەت بوو بۆ ئەحبارو رەهبانیەکان.

(عدي) گوتی ئەی پێغەمبەر خوا ئیمە ئەحبار ورەهبانیەکانمان نەدەپەرست، پێغەمبەر فەرمووی: (أليس يحرمان ما احل الله فتحرمونه) ئه حبار و رهبانیەکان حەلالیان بوتان حرام نەدەکرد وئێوەش گوێ رایەڵی تان دەکردن (ويحلون ما حرم الله فتحلونه)

وه حرامیان بوتان حه‌لال ده‌کرد و ئیوه‌ش به حه‌لال وده‌زانی. (عدی کوری حاتم) گوتی به‌لی، پیغه‌مبه‌ر فه‌رموي: (فتلك عبادتهم) واتا ئه‌وه په‌رستنیان بووه.

ئه‌و لاسایي که‌ره‌وانه‌ی (المقلدون) ئه حبارەکانیان کردبووه خاوه‌ندانی (الارباب) خویان له حه‌لال کردنی ئه‌و شتانه‌ی خوا حه‌رامی کرد بوو بویان، وه له حه‌رام کردنی ئه‌م شتانه‌ی خوا حه‌لالی کرد بوو بویان، زور چاك ده‌یانزانی ئه حبار و ره‌هبانیه‌کان ئاینی خوایان گوریوه، له گه‌ل ئه‌وشدا به دوایان ده‌که‌وتن وگوی رایه‌لی یان ده‌کردن، زور چاك ده‌یانزانی و برواشیان وابوو حه‌لال وحه‌رام کردنه که‌و گوی رایه‌لیه‌که‌یان ته‌نها بو ره‌زامه‌ندی سه‌روکه کانیانه، هه‌لبه‌ته ئه‌وه‌ش کوفره و خواو پیغه‌مبه‌ر ئه‌وه‌یان به هاوبه‌شی (شرك) داناوه، هه‌رچه‌نده نویژیان بو نه‌کردونه وکر نوشیشیان بو نه‌بردونه.

ئابه‌م شیوه بومان روون ده‌بیته‌وه یه‌کتاپه‌رستی، گوی رایه‌لی و مل که‌چی ته‌واوه بو خوای (جل جلاله)، وه ری

کردنه له سەر ڕێبازی قورئان و سوننەت بەراستی ودلسوزی بی کەم و کوری.

گۆرپەرستەکان لە سەرگۆراکاندا گومەزو مناره دروست ئەکەن، ودەیان رازێننەوه و زۆر بە پیروز و سوودبەخشی ئەزانن، وە ئەوانەی بەدوای سەروك و گەورەکانیان دەکەون گوێ رایەلیان دەکەن بەدوای دەستوورو رژێمە گلاوەکانیان دەکەون، ئەمانە هەموویان ریگایان لێ وون بووه چونکه هیچ کسیك شایەنی پەرستن نیە. نه پێغەمبه ر و نه شیخ و نه ئیمام ونه هیدی، تەنها خوا نەبیت داهێنەرەو شایەنی پەرستنه .

خوا ئەفەرموی:

﴿ ومن الناس من يتخذ من دون الله انداداً يحبونهم كحب الله﴾ (البقرة : ١٦٥)

«خوای (جل جلاله) حالی موشریکەکان مان بە یاد دەهێنتەوه چۆن هاوبەشیان بۆخوا پەیدا کردبوو

﴿ ومن الناس من يتخذ من دون الله اندادا

**یحبونهم کحب الله﴾** ئەو موشریکانەی هاوبەشیان بۆ خوا پەیدا کردووە ﴿ **اندادا**﴾ ابن عباس والسدی (خوایان لی رازی بیت) دەڵین ﴿ **اندادا**﴾ واتا سەروکەکانیان ئەوانەی بە دوایان دەکەوتن. ﴿ **یحبونهم کحب الله**﴾ واتا لە خوشویستن ئەو بت وصەنەمانەیان لە گەڵ خوای(جل جلاله) بە یەکسان دادەنا.

(شیخ الاسلام) ( خوای لی رازی بیت ) ئەڵی:

«هەرکەسیك داوای جیٚ بەجیٚ کـردنی پێویستی یەکانی و لا بردنی گیرو گرفت ونا خوشی لەسەر خۆی جگە لە خوای (جل جلاله) داوا بکات، هۆگری بێت و خووی خوی بداتیٚ، واتا ئەو ئەپەرستی»،

تابرین و نوشتە[1] و خۆ پیٚ هەڵواسین وهۆگری بە داهێنراوەکان، بە مەبەستی سود بەخشین ولا بردنی زیان وباوەڕ کردن بە فالچی وسحرباز[2] ونەزر گرتن بو غەیری

(١) پێغەمبەری مەزن ئەفەرمووی: (ان الرقى والتمائم والتولة شرك) (حديث صحيح) بروانە پەڕاوی (صحيح الجامع الصغير) ی شیخ البانی.
(٢) پێغەمبەری سەردار ئەفەرمووی: (من أتى عرافاً أو كاهنا فصدقه بما يقول فقد كفر بما انزل على محمد) هەمان سەرچاوەی پیشو.

خوای (جل جلاله)، هەروەها پەنابردن و داوای یارمەتی کردن جگە لە خوای (جل جلاله) ئەمانە هەمووی ئەگریتەوە.

خوا ئەفەرموێ:

﴿ قل إن صلاتي ونسكي ومحياي ومماتي لله رب العالمين، لا شريك له﴾ (الأنعام : ١٦٢ - ١٦٣)

خوای (جل جلاله) بە پێغەمبەر ﷺ را دەگەیەنی بە موشریکەکان بلێ ئەو موشریکانەی جگە لە خوا کەسانی تر دەپەرستن ﴿إن صلاتي ونسكي....﴾.

واتا نوێژکردنم و قوربانی سەربڕین و... هەموو جورە عیبادەتەکانم تەنها بۆ خوای پەروەردگارە».

هەروەها ئەفەرموێ :

﴿ إنه من يشرك بالله فقد حرم الله عليه الجنة ومأواه النار﴾ (المائدة : ٧٢)

«واتا هەرکەسی هاوبەش بۆ خوا دابنێ، لە رۆژی دوای خوای (جل جلاله) بە هەشتی لێ قەدەغە دەکات، لەو

ڕۆژدا هیچ کەسێك نیە یارمەتی بدات وهانای بۆ ببەری بۆ ڕزگار بوونی لە عەزابی دۆزەخ».

هەروەها ئەفەرمویّ:

**﴿ إن الله لا يغفر أن يشرك به ويغفر ما دون ذلك لمن يشاء ﴾** (النساء : ٤٨)

واتا خوای (سبحانه وتعالى) لە بەندەیەك خۆش نابێت هاوبەشی پەیدا کرد بێت بۆ خوای (جل جلاله) لە دونیادا، هەر بە موشریکی مابێتەوە تاکو مردن، **﴿ إن الله لا يغفر أن يشرك به ﴾** خوای مەزن لە بەندەیەك خۆش نابێت بە موشریك مابێتەوە تا مردن، **﴿ ويغفر مادون ذلك لمن ... ﴾** جگە لە شرك وهاوبەشی پەیداکردن خوای (جل جلاله) لە هەموو گوناهێکی تر خۆش دەبێت بە پێی ویست ئیرادەتی خوی.

(شیخ صنع الله الحنفی) (خوای لی رازی بیت):

لەپەراوەکەی خوی دا کە لە بارەی بەرپەرچ دانەوەی ئەوکسانەی نووسیوە ئەلیّن (اولیا)ی خوا پاش مردنیان

توانای دەستکاری یان هەیە لە ژیانی مروڤ، ئەلیٚ ئیستا هەندی کەس پەیدا بوونە باوەڕیان وەهایە شیخ و ئەولیاء توانای دەستکاری یان هەیە لە ژیان پاش مردنیان، بۆیە هانا ئەبەنە بەر گۆڕەکانیان، داوای خیر وخوشیان لـی ئەکـەن وەهە میشـە لـە کـاتی تەنگانە و نا خوشیش هەر داوای یارمەتیان لیٚ ئەکەن، دەچنە لای گۆڕەکانیان ودەپارینەوەو دەگرین وهاوار دەکەن بۆ یارمەتی و دەرباز بوونیان لە گیر وگرفت. جگە لەوەش قوربانیان بۆ سەر ئەبرن و نەزریان بۆ دەگرن ..... هتد.

لیرەدا (شیخ صنع الله) ئەلیٚ ئەمانە ستەمکارن ولە سنور دەرچوونە، هەر کەسیٚ بەم ڕیبازە دا بڕوا لە ڕۆژی دوایی دا ئەنجامی ئیش وئازاری دوزەخ وناخوشی هەمیشەیی یە بەهـۆی هـاوەل (شرك) پەیـدا کـردنی بۆ خـوای (جل جلاله) وەلادانی لە ڕیبازی قورئانی پیرۆز.

خوا ئەفەرمویٚ: ﴿ ومـن يـشاقق الرسول مـن بعد مـا تـبين له الهدى ويتبع غير سبيـل المؤمنين

نُوَلِّهِ مَاتَوَلَّى وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ وَسَاءَتْ مَصِيرًا﴾[1]
﴿ ومن يشاقق الرسول من بعد ما تبين له الهدى﴾ «واتا هەرکەسێك ڕێبازێکی تر جگە لە ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ بگرێتە بەر پاش ئەوەی ڕاستی وناڕاستی بۆ ڕوون بووە، ئەوە لە ڕێگای لاتەرێکی شەریعەتی خوا (جل جلاله) وپێغەمبەر ﷺ دەڕوا.

﴿ ویتبع غیر سبیل المؤمنین﴾ یانی بە دوای ڕێبازێکی تر دەکەوێت جگە لە ڕێبازی خوا پەرستان و ئیمانداران».

ڕاستی ئەمەش هەروەك زانایان ئەڵێن :

هەرچی فەرمانێك خوای (جل جلاله) وفەرمانی پێ دابێت وبەندەش بە دلسوزی و ڕێك وپێکی جێ بەجێ ی کردبێ ئەمە بو خوایە .

ئەگەر هات و بەندە یەك توزقالێ لەم پەرستنانە بدات بە شتێکی تر، ئەوە هاوەڵ (شرك)ی بۆ خوا پەیدا

[1] (النساء: ١١٥)

کردوە،ئەوکاتە ئەبێتە موشریکێکی تەواو و لە ئیسلام و نەتەوەی پێغەمبەر دەردە چی.

خوا ئەفەرموێ:

﴿قل الله اعبد مخلصا له ديني﴾ (الزمر: ١٤)

واتا: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە موشریکەکان رابگەیەنەو پێ یان بڵێ من لەسەر رێبازی خۆم دەڕۆم تەنها خوای (جل جلاله) دەپەرستم و هاوبەشی لە هیچ شتێك بۆ خوای (جل جلاله) پەیدا ناکەم.... بەڵام ئێوەی هەڵخەڵەتا و هەرچی دەپەرستن بیپەرستن جگە لە خوای (جل جلاله) وە خۆشتان ئامادەکەن بۆ ئەنجامێکی دوراو لە رۆژی قیامەت وسزایەکی سەخت لە دوزەخ دا.

## سێ یەم

# یەکتایی ناو و رەوشتەکانی خوا
# (توحيد الأسماء والصفات)

ئەمەش زانین وباوەڕی تەواو وراستەقینەیە بە ناو و سیفەتەکانی خوای (جل جلاله)، پێویستە بە پاك ومبارەك بزانری، بە تایبەتی لە وشتانەی بە ناو و رە وشتە کانی خوا ناشێ ، چون خوای گەورە لە هیچ رووێکەوە بە هیچ شێوەیەك کەم وکوری نی یە، پاك وبێ وێنە یە لە هەموو روویکەوە. وە هەر شتیك لە رووی ناو و سیفەتەکانی خوای (جل جلاله) هاتووە لە قورئانی پیرۆزو باسی لێ کردوە، موسولمان ئەبێ باوەری تەواوی پێ هەبێت و بەراست ودروستی بزانێ ، هەروەها ئەو رەوشتانەی پێغەمبەر ﷺ باسی لێ کردون وبۆی روونکردوینەتەوە

ئەبێ باوەڕی تەواوی پێ بێنین . وە ئەبێ باسی خوا بەو شێوەیە بکرێت کە خوا خوی باسی خۆی کردوە بە بێ گوڵجاندن و وینە هێنانەوە بۆ ڕەوشتەکانی، وەیان باس کردنی بە لەیەك چوون بەو شتانەی  لە بەر چاون لە جیهاندا ،یان بەراووردکردنی بە دروستکراوەکان، ئەمانە هەمووی بە هیچ شێوەیەك نابێت چونکە خوای گەورە بێ وینەیەو بێ گەردە ودوورە لە گشـت ناتەواوی یەك.

خوا ئەفەرموێ: ﴿ **ليس كمثله شيء وهو السميع البصير** ﴾ (الشورى : ١١)

﴿ **ليس كمثله شيء** ﴾ هیچ شتیك نیە لە وێنەی خوا بچێ لە هیچ شتیك ﴿ **وهو السميع البصير** ﴾.

ئاگاداری هەمور شتێکە وگوێ لە هەمور هەستیك هەیە ، وە هیچ شتیکیش شاراوە نیە لە خوای (جل جلاله) ، لێ ی دیارە و دەیبینێ.

# سەرئەنجامی لە ئیسلام دەرچوون (نواقض الاسلام)

ئەو کارانەی کە هۆن بۆ هەلوەشاندنەوەی (لا اله الا الله) لە هەمان کاتدا کاریگەرن بۆ هەلوەشاندنەوەی یەکتاپەرستی پەروەردگاری ویەکتاپەرستی خوایی و یەکتاپەرستی ناو و سیفەتەکانی خوای (جل جلاله).

زانایانی پێشو (خوایان لی رازی بیت) ئەم کارانەیان بۆ ئێمە روون کردوتەوە و ئێمە یان ئاگادار کردۆتەوە بۆ ئەوەی نەکەوینە ناو ئەم گێژاوەو توشی سەر لێ شێواوی وگومرایی نەبین، لێرە دا زانایان دادی دەرچوون لە ئیسلامیان (حکم المرتد) لە سەر ئەو کەسانە داوە کە

ئەکەونە ناو ئەوهەڵانەوە کە مرۆڤ لە ئیسلام دەر دەکات.

بۆیە زانایان ئەڵێن دە کار هەن مروڤ لە ئیسلامەتی دەردەکات، ئەم شتانەش ئەمانەی خوارەون.

١ ـ هاوەڵ (شرك) پەیدا کردن لەپەرستنی خوای (جل جلاله).

خوا ئەفەرموی: ﴿ إنه من يشرك بالله فقد حرم الله عليه الجنة ومأواه النار وما للظالمين من أنصار﴾ (المائدة: ٧٢)

«هەرکسی هاوەڵ بۆ خوای تاك وتەنها پەیدا بکات بەهەشتی لێ حرام دەبێت و ئەچێتە دۆزە خەوە، هیچ هێزیکیش نیە بە هانای بێت، و رزگاری بکات».

لەو شتانەی کە بە هاوەڵ (شرك) پەیدا کردن دائەنرێ

* پارانەوە و هانا بردنە بەر غەیری خوای (جل جلاله).

* داوای فریا کەوتن لە مردوو وگورەکانیان .

* نەزر گـرتن وسەربرین[1] بو غەیری خـوا .

* ترسان لە هیزی غەیبی غەیری خوا[2].

خـوا ئەفەرموی: ﴿إن الله لا يغفر أن يشرك به ويغفر ما دون ذلك لمن يشاء﴾ (النساء : ٤٨)

﴿إن الله لا يغفر أن يشرك به﴾ خوای (جل جلاله) بە هیچ کلۆچێ لەو موشریکانە خۆش نابێت کە هاوەلیان بۆ خوا پەیدا کردوە تا مردن و توبەیان نەکردوە.

﴿ويغفر مادون ذلك لمن يشاء﴾ خوای گەورە لە هەر گوناهێکی تر خوش دەبێت لە بەندەکانی بە پێی ویست وئیرادەتی خوی تەنها لە شرك نەبیت.

٢ ـ هەر کەسێك لە نێوان خوی وخوا هـۆ دابنێ و داوای شفاعەتی لی بکات ڕپشتی پی ببەستی و (توکل) وەها تێ بکات ئەو هۆیە (وسیلە) پێ ی ئەکری خوای لێ رازی بکات، ئەوە کافرە ولە ئیسلام دەرچوە بە

(١) پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: لعن من ذبح لغير الله.

(٢) بروانە پە راوی(فتح المجيد)بە شی جۆرە کانی ترس.

گـوفتــاری هەموو زانایانی ئیسلام.

٣ ـ هەرکەسێك کافرو موشریکی پێ کافر نەبێت و ڕێبازو بیرو باوەڕیانی پێ دروست بێت و بۆیان ڕاست بکاتەوە ئەمەش کوفرە ولە ئیسلام دەرچوونە .

٤ ـ هەر کەسێك تیورو دەستورو ڕێبازە دروست کراوەکانی دەست کردی مرۆڤی. پی ڕاست بێت و بە باشتری بزانێ لە دەستورو ڕیبازی ئیسلام ، یان وەها تی بگات ئیسلام بە کەڵکی چەرخی بیستەم نایەت، یان وابزانی، ئیسلام هۆی دوا کەوتن و نەزانی یە، هەروەها واتی بگات ئیسلام ئاینیکە تە نها پەیوەندی بە خواوە هەیە و دوورە لە کار وباری مرۆڤ وژیان.

یان بلێت دەست برینی دزو، ڕەجم کردنی زیناکار شتیکی ناشرینە و لەگەڵ زەمانە دا ناگونجێ، وە یان باوەڕی وا بێت هیچ شتێك ڕیگای ناگری حوکم بکات بە هەر دەستورو ڕێبازیکی تری دروست کراو لەلایەن مرۆڤەوە، ئەم کەسانەش لە سـنووری ئیسـلام دەرچونە و

پەیوەندیان بە ئیسلامەتی نەماوە بەرای هەموو زانایانی ئیسلام.

٥ ـ هەرکەسێك رق و قینی هەبێت بەرامبەر بە فەرمانیك لەفەرمانە کانی خوای(جل جلاله) ئەگەر چی بە کردەوەش ئەنجامی بدات ئەمەش کوفرە.

بەپێ ی ئەم فەرمودەی خوا:

﴿ ذلك بانهم اتبعوا ما اسخط الله وكرهوا رضوانه فاحبط اعمالهم﴾ (محمد : ٢٨ )

﴿ ذلك بانهم اتبعوا ما اسخط الله﴾

ئەوتاوانبارو کافرو موشریکانە، بە ئارەزوی خۆیان بە دوای رێگای لاتەریکی ئیسـلامی پیرۆز کەوتون، لە نیفاق و گوناهکاری وخیانەت وخوفروشی، بۆ دوژمنانی خوای (جل جلاله)، وە هۆگری رێبازی کوفر بوون.

﴿وكرهوا رضوانه﴾ رق و قینیان هەبوو بەرامبەر رەزامەندی خوای (سبحانه وتعالى)، و نارازی بوون بە ریگای قورئانی پیرۆز، وبە پێچەوانەی ئەمەش هەمرو

هێزو توانای خویانیان بە کار هێنا بۆ دژایەتی خوای (سبحانه وتعالى). ﴿ **فاحبط اعمالهم** ﴾ ئەو کارو کردەوانەی شانازیان پێوە دەکرد لە خیانەت و خیانەت کاری لە گەل موسلمانان، وە لای خویان بەگرنگیان دەزاني، هەموویان لیّ پووچ دەبیتەوەو رەسوا دەبن لە روژی قیامەت.

٦ ـ هەرکەسێك گالتە بەرێبازی ئیسلام بکات وەیان گالتە بە سزادان و پاداشتی رۆژی دوای بکات لە ئیسلام دەرئەچی.

خوا ئەفەرموێ: ﴿ **قل اباالله وآیاته ورسوله كنتم تستهزئون، لا تعتذروا قد كفرتم بعد إيمانكم** ﴾ (التوبة: ٦٥-٦٦)

٧ ـ جادوگەری وفالچیەتی: هەر کسێك ئەم کارانە بکات وپێی رازی بێت، ئەمەش گومرایەو لە ئیسلام دەرچووە.

خوا ئەفەرموێ: ﴿ **وما يعلمان من أحدٍ حتى**

**يقولا إنما نحن فتنة فلا تكفر﴾** (البقرة : ١٠٢)

٨ ـ يارمەتی دانی موشریك وكافرەكان دژی موسولمانان : **﴿ومن يتولهم منكم فإنه منهم إن الله لا يهدى القوم الظالمين﴾** (المائدة : ٥١)

خوای (جل جلاله) بە هیچ كلۆجێك رازی نابێت موالاتی جولەكەو وخاج پرستان بكرێت چونكە ئەمانە گەورترین دوژمنی ئیسلام وموسلمانانن (قاتلهم الله). پاشان خوای (جل جلاله) ئاگادارمان دەكاتەوە، ئەمانە لە نیوان خویاندا موالاتیان هەیە، هەركەسێك موالاتیان بكات خوا زۆر بەتوندی هەڕەشەی لی دەكات و دەفەرموی **﴿ومن يتولهم منكم فإنه منهم﴾** یانی هەركەسێك موالاتی ئەم كافرانە بكات واتە لەوانە».

٩ ـ هەر كەسێك، بیروباوەڕی وابێت كسانی هەن ئەگەنە پلەوپایەیەك خوا پەرستنیان لە سەر نامێنی بەرای خویان، چونكە گەیشتوونە تە بەرزترین پلەی ئیمان، ئەو جۆرە بۆ چونە لە روانگەی ئایینەوە لەئسلام دەرچوونەو

ڕێگایەکی دی یان گرتۆتە بەر.

﴿ ومن يبتغِ غير الإسلام ديناً فلن يقبل منه وهو فى الآخرة من الخاسرين﴾ (ال عمران: ٨٥)

﴿ ومن يبتغ غير الإسلام ديناً﴾ یانی هەرکەسێك ڕێگایەکی تر بگرێتە بەر جگە لە ڕێبازی ئیسلام وشەریعەتی خواو پێغەمبەر، هەلبە تە خوای (جل جلاله) بە هیچ شێوەیەك لیٚ ی ڕازی نابێت و لیٚ ی وەرناگریٚ، پێغەمبەری خوشەویست ﷺ دەفەرمویٚ (من عمل عملاً ليس عليه امرنا فهو رد) واتا هەر کاریك ئەگەر بە پێی قورئان و سونتەت نەبێت وەرناگیریٚ وقەبول نابێت».

﴿ وهو فى الآخرة من الخاسرين﴾ هەرکەسێك لە ڕێبازی ئیسلام لاتەریك بێت لە ڕۆژی قیامەت لە گەل کافرو ستەم کارو دۆڕاوەکان دائەنرێت.

١٠ ـ نەویستنی ئیسلام وبەرهەلستی کردنی: هەر کسێك بەرهەلستی ئیسلام بکات وبیزاری دەربریٚ، یان

به تەواوی ئیسلامی نەویت وکاری پێ نەکات کافر نەبێت .

خوا ئەفەرموێ :

﴿ ومن اظلم ممن ذُكِّر بآيات ربه ثم أعرض عنها إنا من المجرمين منتقمون﴾ (السجدة : ٢٢)

﴿ ومن اظلم ممن ذكر بآيات ربه﴾ «زالمترین وستەمکارترین کەسانێ ئەوانەن ئاياتی خوايان بۆ روون دەکرێتەوە، پاشان پشتی تێ ئەکەن ورووی لێ وەر دەگێرن و لە يادی خۆيان دەبەنەوە هەروەك لە ئەوەلەوە گوێ يان لێ نەبوو بێ.

﴿ إنا من المجرمين منتقمون﴾ خوا (سبحانه وتعالى) تولەيان لێ ئەسێنێتەوە بە هۆی ئەم کارانەيان».

لێرەدا جياوازی بە دی ناکرێت لە نێوان ئەوکە سانەی بە گالتە بەرهەلستی ئيسلام ئەکەن و ئەوانەی بە راستی (جدی)، وە ئەوانەی لە ترسی خەلك ئەم کارە ئەکەن، تەنها ئەم کەسانە نەبێت کە لە دلەوە نارازين وپێ يان

خوش نی یه بەر هەلستی ئیسلام بکەن بەلاّم لە ترسی کوشتن وبەزوورەملی چەند شتێك ئەلین: ﴿ **إلا من أكره وقلبه مطمئنٌ بالإيمان** ﴾ (النحل: ١٠٦)

«واتا: تەنها ئەوکەسانە نەبێ کە دلنیان لە ئیمانەکایان بەلام بە زۆلە ملی، کوفریان پێ دەکەن».

ئێستا بۆمان روون بۆوە هەر کەسێك هاوەڵ (شرك) پەیدا بکات بۆ یەزدانی مەزن نوێژو رۆژوو زەکات و هەموو چاکەوکردەوەیەکی بە بادا دەڕوات و لیّ ی وەرناگیری .

خوا ئە فەرموی : ﴿ **ولقد أوحي إليك وإلى الذين من قبلك لئن أشركت ليحبطن عملك ولتكونن من الخاسرين** ﴾ (الزمر : ٦٥)

واتا: لە ریگای وە حیەوە تۆش وپێغەمبەرانی پێش تۆش ئاگادار کراینەوە لەسەر رێبازی یەکتاپەرستی برۆن وهاوبەش پەیدا نەکەن بۆ خوای (جل جلاله).

﴿ **ولئن أشركت** ﴾ خطاب بۆ پێغەمبەرو هەموو

موسلمانانه، واتا ئەگەر هاوبەش بۆ خوای (جل جلاله) پەیدا بکەن ﴿ ليحبطن عملك﴾ کارو هەولدانە کەت بێ کەلك وپوچ دەبێتەوە سوودی نابێت لەرۆژی قیامەت».

هەروەها ئەفەرموێ: ﴿ ولو أشركوا لحبط عنهم ما كانوا يعملون﴾ (الأنعام : ٨٨)

«ئەگەر هات و هاوبەش پەیدا بکەن بۆ خوای (جل جلاله) کارە چاکەکانیان بێ کەلك دەبێت و هیچ سوودی نابێت بۆیان لەرۆژی قیامەت».

لە پەرتووکی (الرساله السنية) شيخ الاسلام ئەلێ ئەگەر لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ کە سانێ بوو بێت کە لە ئیسلام دەرچووبن وبە موشریك وکافری مردوو بن لە گەلْ ئەو هەموو خوا پەرستنەشیان لە نوێژوو رۆژ و حەج وشەونوێژوو جیهادو ..هتد.

با چاك بزانین ئیمرۆش لەو زەمانە زۆر کەس هەیە خۆیان بە موسولمان ئەزانن وبەلاّم ئیسلامەتیەکەیان

لێ وەرناگیرێ لە لایەن یەزدانەوە چونکە قەبارەی شیخ ومشایەخەکان زیاتر لە پایەی خۆیان بەرزدەکەنەوە تا ئەگاتە رادەیك زۆر لە صیفەت ورەوشتی خوایەتی یان پێ ئەدەن، باوەڕیان بە جۆرێك دەبێ ئەمانە توانا و دەسالاتی تەواویان هەیە لەم گەردونە، وە ئەتوانن گۆرانی بەسەر دا بهێنن هەتا وا هەست ئەکەن کە ئەو جۆرە کەسانە توانای دەستکاریان هەیە لە مردن وژیانیش جا هەر کەسی صیفەتی خوایەتی بدات بە مرۆڤ هەر چەندە ئەوکە سە پایەو پلەیشی بەرز بێت لە ئیسلام، یا پێغەمبەریش بێت ئەم جۆرە کەسانە ئەگەر تۆبە نەکەن ئەبێ بکوژرێن.

خوای گەورە پێغەمبەران وبەڕاو وبەرنامەی بۆ ئادەمیزاد رەوانە کردوە بۆ ئەوەی تەنها ئەو بپەرستن بەبێ هاوەڵی.

ئەم کەسانەی لە گەڵ خوا دا کە سانی تر و شتی تر ئەپەرستن وەك حەزرەتی مسیح و فرشتەکان و هەر

شتێکی تر به هیچ شێوەیەك باوەڕیان نیە ئەمانە داهێنەر (خالق) بن بەڵکو ئەیان پەرستن بە بیانوی ئەوەی لە خوایان نزیك کەنەوە .

خوا ئەفەرموێ: ﴿ ما نعبدهم إلا ليقربونا إلى الله زلفى﴾ (الزمر:٣)

هەروەها خوا ئەفەرموێ:

﴿ ويقولون هؤلاء شفعاؤنا عند الله﴾(يونس:١٨)

لێرەدا لەبەر ئەم هۆیانە خوا پێغەمبەرانی ڕەوانە کردوە بۆ ئادەمیزاد کە هاوەڵ (شرك) پەیدا نەکەن و لە یەکتاپەرستی لا نەدەن، هەمیشە مل کەچی وگوێ ڕایەڵی و پەرستنی یان هەر بۆ خوا بێت .

(ابن القيم) (خوای لێ ڕازی بێت) ئەڵێت هاوەڵ پەیدا کردن بۆ خوا چەند جۆرێکە لە مانە داوای پێویستی ژیان لە مردووەکان وهاناو پەنا بردن بۆیان، ئەڵێ ئەمانە هاوەڵ پەیداکردنێکی تەواوە.هەروەك ڕوون وئاشکرایە مردوو بۆ خۆی هیچی پێ ناکرێ جاچون سوودو زیان دەبەخشی بە

کەسانێ کە لە ژیاندابن[1].

هەندێ لە زانایانی ئیسلام ئەو کارانەی ئەبنە هۆی هەڵوەشاندنەوەی یەکتاپەرستی کورتیان کردوتەوە بەم شێوەیەی خوارەوە .

* ئینکار کردنی بوونی دەسەڵاتی خوا بۆ دروست کردنی هەندێ بوونەوەر لەم جیهانە دا هەروەك ئەڵێن سروشت دروستی کردوون و لەخۆیانەوەو بە صودفە دروست بوون، هەروەك بێ بڕواو سەر لێ شیواوە کۆمۆنیستەکان ئەڵین.

* ئینکار کردنی شتێك لە رەوشتە تەواوەکانی خوا وەك زانین وقسە کردن و گوێ گرتن (سمع) وبینین و (بصر).

* وەیان هەندێ لە صفات ورەوشتی خوایەتی بدرێتە داهێنراوەکان (مخلوقات) وەك زانینی غەیب.

---

(١) پێغەمبەری خوا ئەفەرمووێ: (اذا مات الانسان انقطع عمله الا من ثلاث صدقة جارية،او علم ينتفع به،او ولد صالح يدعو له) رواه الشيخان.

* کڕنۆش بردن بۆ غەیری خوا.

* لا یە نگیری دووژمنانی خوا لە گاور وجولەکە و ئاگر پەرستان وکۆمۆنیستان.

* گاڵتە کردن بە قورئانی پیروز .

* ئینکار کردنی ئەو غەیبیانەی کە خوا ئیلهامی دڵی پێغەمبەری کردوە ئەویش ئیمەی ئاگادار کردۆتەوە لە رووداوەکانی ئایندە وەك نیشانەکانی رۆژی دوایی و گەلی شتی تر.

* ڕەت دانەوەی شتیکی روون و ئاشکرا لە ئایین.

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين

## ناوەرۆك